# تەزکیەو تەبلیی
# و
# یەکریزی و برایی

نوسینی
علی باپیر



ڕەمەزانی ١٤١٨ ك    ١٩٩٨ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على جميع الانبياء والمرسلين خصوصا سيدهم وخاتمهم محمد امام المتقين، وقائد المجاهدين وآله وصحبه أجمعين ومن اهتدى بهديه وسار بسيرته الى يوم الدين..

ئەندام و پێشمەرگەو دۆست و لایەنگرانی بزوتنەوەی ئیسلامی بەڕێزو خۆشەویست!

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بەپێویستم زانی بەبۆنەی ئەم مانگی پڕ بەرەکەتی رەمەزانەو لەکەش و هەوایەکی برایەتیو پڕ محبەت و رێزو سۆزدا بەرانبەر بەیەکتری بەمەبەستی بیرخستنەوەو زیاتر زەمینەسازی بۆ برایەتیو رێزو تەقدیرو خۆشەویستی بۆ یەکتر ئەم چەند خاڵەتان ئاراستە بکەم:

## یەكەم

هەروەك چۆن جەستەی ئینسان دووچاری چەندان جۆرە نەخۆشی دەبێ كە دەبنە هۆی لاواز بوونیو پەك كەوتنیو زۆر جار مردن و لەبەین چوونیشی، رووحیشی بەهەمان شێوە گیرۆدەی دەردوو نەخۆشی دەبێت، بۆ وێنە خوای زاناو كاربەجێ هەر كام لە تەعبیری ﴿.. في قلوبهم مرض...﴾ البقرة.. ﴿ثم قست قلوبكم..﴾ البقرة.. ﴿كلا بل ران على قلوبهم...﴾ المطففين.. وەك دەبینین لەئایەتی (١٠)ی (*البقرة*)دا بەڕاشكاوی باسی نەخۆشی (مرض)ی جۆرێك لە دلان دەكات، كە دلی دەغەڵ و دووڕووەكانەو لەئایەتی (٧٤) البقرەش باسی رەق هەلاتن (*قسوة*)ی جۆرێكی دیكە لەدلان دەكات كە دلی جوولەكەكانەو، لەئایەتی (١٤)ی (المطففين)یش باسی ژەنگ گرتنی جۆرێكی دیكەی دڵەكان دەكات كە دلی بێ بڕواو هاوبەش پەیداكەرانی بێ ویژدانە، جابێگومان هەر كام لە (دڵ رەقی)و (ژەنگ گرتن)یش دوو جۆرە نەخۆشین لەونەخۆشییە زۆرو زەوەندانەی كە تووشی دڵ و رووحی ئینسان دەبن، لەكاتی سەرگەردانیو لادان و [illegible] لە ئایین و بەرنامەی خوادا.

پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لەو بارەوە فەرموویەتی: (*إن هذه القلوب تصدأ كما يصدأ الحديد اذا اصابه الماء، قيل: وما جلاؤها يارسول الله؟: قال: كثرة ذكر الموت وتلاوة القران*) رواه البيهقي

واتە: ئەم دڵانە ژەنگ دێنن وەک چۆن ئاسن ژەنگ دێنێ. گوترا: ئەی پێغەمبەر خوا بەچی سپی دەبێتەوەو ڕوون دەبێتەوە؟ فەرمووی: بەقورئان خوێندن و یادی مردن.

جا دیارە مانگی رەمەزانیش مانگی زیکرو فیکرو قورئان خوێندن و تەقواو تاعەت و بیرکردنەوەیە لە مردن و گۆڕو ژیانی بەرزەخ و...هتد. دەبا لەم مانگە موبارەکەدا زۆر بەجیدی دەست بەکار بین لە پاککردنەوەی دڵ و دەروونمان و شۆردنی ڕووح و گیانمان و خۆ لەبێژنگ دان و بژارکردن بەهیوای ئەوەی کە لەژەنگ و ژارو چڵک و چەپەرو زەمەندو بژار قوتارمان بێت، ئەو ژەنگ و ژارو چڵک و چەپەرو زەمەندو بژارەی کە ماک و میکرۆبی زۆربەی هەرە زۆری دەردو نەخۆشی و ئێش و ژان و کێشەو گیروگرفتەکانمانن وەک خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿*أولما اصابتكم مصيبة قد أصبتم مثليها قلتم انى هذا؟! قل هو من عند أنفسكم*﴾ آل عمران.

## دووەم:

تــەقوا بەرهــەمی عیبــادەت و برایــەتیو نێــوان خۆشــبوونیش زادەی تەقوایــە. خــوای كاربــەجێ دەربــارەی حیكمــەتی فــەرزكرانی ڕۆژووی مــانگی ڕەمــەزان فەرموویــەتی: ﴿یاایها الذین آمنوا كتب علیكم الصیام كما كتب علی الذین من قبلكم لعلكم تتقون﴾ البقرة.. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنــاوە! ڕۆژوو گرتنتــان لەســەر پێویســت كــراوە وەك چــۆن لەسەر ئەوانەی پێشــووتان پێویســت كرابــوو بەشكم پارێزگاری بكەن.

بــەڵێ حیكمــەتی ڕۆژوو گرتــن و هــەر جۆرێكــی دیكــەی خواپەرســتی (عبــادة)یــش پــەیدابوون و گەشــەكردنی خەســڵەتی پارێزكــاری (تقــوی)یــە، كەوابێ هەتا ئینســان خواپەرست (عــابد) تــر بێت، زەمینەی پەیدابوون و خــەملانی خەسڵەتی تــەقوای تێدا هەموارتر دەبێ، ئینجا برایەتیو تەباییو نێوان خۆش بوون و پێكــەوە بــاش بوونیــش زادەو میوەی درەختــی پارێزكــاریو دینداریــیە، چونكــە لەگــەڵێك جێگای قورئــانیدا خــوای زانــاو دادگــەر چاكــەكاریو خــۆش ڕەفتــاری لــەدوا (پارێزكــاری)یــەوە بــاس كردووە، بۆ وێنە:

﴿..فاتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم..﴾ الانفال/١..
﴿..ان الله مع الذين أتقوا والذين هم محسنون﴾ النحل..
﴿ومن احسن دينا ممن اخلص دينه لله وهو محسن..﴾ النساء.

كەواتە: ئەگەر دەمانەوێ كۆشكی مسوڵمانەتیو دینداریمان بەرزو مەحكەم بێ.. بابناغەو زەمینەی پارێزكاریو دینداریمان پتەوو نەلەخشاو بێت، تاكو بتوانین دیواری قایمی برایەتیو تەبایی لەسەر هەڵچنین و سەرەنجام كۆشك و بینای مسوڵمانەتیمان بەرزو جوان و بەرچاو بێت، ئەگەر نا باناگامان لە (خەیاڵ پڵاو) بێت و سوور بزانین كە (كەس بەخەیاڵ نەبووە بەماڵ)!

## سێیەم:

ئێمە سوپاس بۆ خوای سەرچاوەی هەموو نیعمەت و فەزڵ و چاكەیەكە وەك شورای بزوتنەوەی ئیسلامی لە رۆژی سێ شەممە (٨)ی رەمەزانی ئەمساڵ رێكەوتی (١٩٩٨/١/٦) لە كۆبوونەوەیەكی پڕ بەرەكەتی ئیمانیدا، بەیارمەتیو هیدایەتی خوای میهرەبان و پاشان لەبەرەكەتی مانگی رەمەزان و بەهیمەت و عەزیمەتی دڵسۆزان، پاش ئێش و ژان و نارەحەتیو گرفتارییەكی زۆرو.. هتد.. پەیمانمان

بەخوای چاودێرو بەڵێنمان بەیەكتردا كە لەمەودوا ئەوپەڕی توانامان بەكاربێنین كە بەگیانێكی برایانەو دادگەرانەو چاكەكارانەو بەرپرسانە لەبەرامبەر خواو ئاینەكەیدا پێكەوە رەفتار بكەین و سەرجەم دیاردەو نەخۆشی یە گرچووبڕەكانی وەك: بوغزو كینەو دووبەركیێو زەم و غەیبەت و... هتد. بن بڕ بكەین و بەهیچ جۆرێك هیچ كامێكمان رێگا بەخۆیو بەهیچ كەسێك لەدەوروبەری نەدات كە قسەو وتەیەك یان هەڵس و كەوت و رەفتارێكی لێ بپشكوێتەوە كە مایەی نیگەرانیو رەنجاندنی برایەك بێت.

دەجابا هەمیشە ئەم ئایەتە بەهێزو پێزانەی قورئانمان لەدڵدا درەوشاوەو لەگوێدا زرینگاوەبن كە خوای زاناو كاربەجێ یەكسەر پاش راگەیاندنی برایەتی (الاخوه) لەنێو بڕواداراندا فەرمووني:

*﴿انما المؤمنون إخوة فأصلحوا بين أخوكم واتقوا الله لعلكم ترحمون، ياايها الذين آمنوا لايسخر قوم من قوم عسى أن يكونوا خيرا منهم ولا نساء من نساء عسى أن يكن خير منهن ولاتلمزوا أنفسكم ولاتنابزوا بالألقاب بئس الأثم الفسوق بعد الايمان ومن لم يتب فأولئك هم الظالمون، ياايها الذين آمنوا اجتنبوا كثرا من الظن ان*

بعض الظن اثم ولاتجسسوا ولا يغتب بعضكم بعضا أيحب احدكم ان يأكل لحم أخيه ميتا فكرهتموه واتقوا الله ان الله تواب رحيم﴾ الحجرات ١٠-١١-١٢.

کەواتە: کاتێک برایەتی بڕواداران بەبرایەتی یەکی ڕاستەقینە دادەنرێ کە هیچ کام لەم نەخۆشی و دەردە کوشندانەیان لەنێودا نەبن کە بەڕای تێکڕای زانایان هەموویان (گاڵتە بەیەکتر کردن، عەیب لەیەکتر گرتن، ناوو ناتۆرە لەیەکتر هەڵدان، گومان بەد بەیەکتر بردن، جاسوسی لەسەر یەکترکردن، پاش ملە بەخراپە باسی یەکتر کردن) لەریزی گوناهە گەورەکانن، چونکە خوای دادگەر بەئاشکراو بەراشکاوی هەموویانی قەدەغە کردووەو لۆمەو سەرزەنشت و هەڕەشەی ئاراستەی خاوەنەکانیان کردووە. خوا پەنامان بدات.

## چوارەم:

لەسۆنگەی ئەوەوە کە بەندە بەلوتف و بەخشیشی خوا دەست پێشخەری ئەو مەسەلەیە بووم و یەکەم کەسیش بەڵێن و پەیمانم دا بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی سپی و نوێ، بەهەموو ئەندام و پێشمەرگەو دۆست و لایەنگرانی بزوتنەوە بەگشتی و بەتایبەتی برایانی نزیک و دەورو بەرم ڕادەگەیەنم

كە بەهیچ جۆرێك رازی نابم گوێ بیستی هیچ جۆرە زەم و غەیبەت و باس و خواسێكی هیچ برایەكی نێو بزوتنەوە بم بەتایبەت مامۆستاو برایانی خاوەن پایەو بەرپرسیتی.- وەهەر كەسێك لەوانەی كە توانای لێپرسینەوەم لەگەڵیان هەیە شتێكی وایان لێ ببیستێتەوە سزای پڕ بەپێستیان دەدەم، هەرچەندە سوپاس بۆ خوا برایانی نزیك و دەورو بەرم -مەگەر بەدەگمەن- دەنا هەر هاوكارو دەستبارگری چاكەو برایەتیو تەبایی بوون خوا وێنەیان زۆر بكات و پاداشتی هەموو لایەك بەچاكترین شێوە بداتەوە، دیارە نابێ لەم قسانەشم ئەوە بفامرێتەوە كە خۆم و دەورو بەرم بێ خەتاو هەڵە دەزانم بەڵكو لەخوای بەبەزەییو بەخشندە داواكارم بەلوتف و كەرەمی خۆی لەهەڵەو پەڵەو كەم و كوڕییەكانمان ببورێو خراپەكانمان بەچاكە بۆ بگۆڕێ، داوای لێبوردن و گەردن ئازادیش لەسەرەجەم برایان دەكەم و گەردنی هەموو لایەكیش ئازاد بێت لە هەموو هەق و مافێكی بەندە كە بەسەر هەر كەسێكەو ە هەیە بەبێ هەڵاواردن و (استثناء) وەخوا بەلوتفی خۆی هەمووما لەوانە بگێڕێ كە لە هەقیان دا فەرموویەتی:

﴿.. الا من تاب وآمن وعمل عملا صالحا فأولئك يبدل الله سيأتهم حسنات وكان الله غفورا رحيما﴾ الفرقان.

## پێنجەم:

دیارە لێرەشدا بۆیە هەر باسی براو خوشكانی نێو بزوتنەوە كراوە چونكە هەر ئەسلی دواندن (خطاب)ەكە لەگەڵ ئەوانە ئەگەر نا بازنەی برایەتی لە ئیسلامدا یەكجار فراوانەو سەرجەم براو خوشكانی ئیماندار دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی، بەتایبەت ئیسلامیو موسڵمانانی نێو كوردستان كە لە شوێنەكانی تر لێمان نزیكترن و مافیشیان زیاترە بەسەرمانەوە، بەئومێدی ئەوەی ئەو ڕۆژەش نزیك بێ كە تێكڕای مسوڵمانانی كوردستان لەبۆتەی برایەتی‌یەكی ڕاستەقینەدا قاڵ ببنەوەو هەموویان یەكدەنگ و ڕەنگ یەك ڕیزو سەنگ بن لەژێر ئاڵای بەرزو بەرێزی (لااله الا الله محمد رسول الله)دا ﴿وان هذه امتكم أمة واحدة...﴾ المؤمنون..

شایانی باسیشە كە هەڵس و كەوت و ڕەفتاریشمان لەسەر بناغەی پارێزكاری و برایەتی چ لەجوغزی بزوتنەوەی ئیسلامیو چ لە بازنەی سەرجەم ئیسلامی‌یەكانی كوردستان و باقی مسوڵمانانیشدا بەس شتێكی پەسەندو سوننەت نیە كە تێیدا

سەرپشك و خاوەنى هەڵبژاردن (اختيار) بين! بەڵكو شتێكى فەرزەو هيچ مەوداو بوارى خۆ لادان و ئەملاولاكردنمان نيە، مادام بمانەوێ لەلاى خوا بەپارێزكارو ديندار حيساب بكرێين و رەحمەت و بەزەيى خوا بمانگرێتەوە، ئەدى ئەوە نىيە خواى پەروەردگارمان بەراشكاوىو روونى فەرموويەتى:
﴿إنما المؤمنون إخوة فأصلحوا بين أخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمون﴾!!

## شەشەم:

ئێستاش خوشك و برا خۆشەويستەكانم! بۆ ئەوەى لەبوارى هەڵس و كەوت و رەفتارى برايانەو ئيماندارانەدا بەرچاوتان روونترو رێگاتان لەبەردەمدا تەخت و هەموارتر بێت بەپێويستى دەزانم لەژێر سەرباسى (ئەرك و مافەكانى برايەتى لەئيسلام)دا ئەو مەسەلەيەش بتوێژمەوە....

## ئەرك و مافەكانى برايەتى لەئيسلامدا[1]

بۆ روون كردنەوەى ئەرك و مافەكانى برايەتى لەئيسلام دا وائەم چەند چەپكە گوڵە لە گوڵزارى فەرمايشتە پيرۆزەكانى پێغەمبەر (ﷺ) دەچنين:

---

[1] ئەم باسە لە كتێبى (چەند رێنوێنى يەك بۆ ئيسلامى يەكانى كوردستان) وەرگيراوە بروانە لاپەڕە (٤٥-٤٨).

- *(المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضا، وشبك بین أصابعه)* متفق علیه، واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەک دیوارە هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات، وەپەنجەکانی هەردووک دەستی خستە نێویەک و توندی کرد.

ئیمام قورطوبي لەلێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا گووتوویەتی: (ئەمە وێنە هێنانەوەیەکە مەبەست پێی هاندانە لەسەر هاوکاری بڕوادار بۆ بڕوادارو یارمەتی دانی، وەڕوونی دەکاتەوە کە ئەمە شتێکی داکۆکی لەسەر کراوو پێویستە، چونکە خانوو تەواو نابێ‌و سوودی لێ نابینرێ ئەگەر هەندێکی هەندێکی رانەگرێ‌و بەهێزی نەکات، وەئەگەر وانەبێ هەموو بەشەکانی لەیەک دەترازێن و خانووەکەش لەبەر یەک هەڵدەوەشێ، بڕوادایش بەهەمان شێوە بەبێ یارمەتی‌و پشتیوانی‌ی برایەکەی ناتوانێ کاروباری دینداری‌و دنیایی خۆی راپەڕێنێ‌و بەبێ هاوکاری لەبەردەم جێبەجێ کردنی کاروباری‌دا دەستەوستان دەبێ‌و ناتوانێ بەرهەڵستی‌ی زەرەرو زیانەکان بکات و لەحاڵەتێکی واشدا کاروباری دین و ژینی لێ تێک دەچێ‌و دەفەوتێ)[2].

---

[2] بڕوانە پەراوێزی (ریاض الصالحین) ...

- (المسلم أخو المسلم لايظلمه ولايسلمه، من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته، ومن فرج عن مؤمن كربة فرج الله عنه بها كربة من كرب يوم القيامة، ومن ستر مسلما ستره الله يوم القيامة) متفق عليه، واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە نەستەمی لێ دەكات و نەتەسلیمی دوژمنیشی دەكات، هەر كەسێك پێویستی برایەكی خۆی جێ بەجێ بكات، خوا پێویستییەكانی بۆ جێبەجێ دەكات، وەهەر كەسێك خەمێك لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ، خوا خەمێك لەخەم و پەژارەكانی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وەهەر كەسێك عەیبی مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا ڕۆژی دوایی دەیپۆشێ.

- (المسلم أخو المسلم لايخونه ولايكذبه ولايخذله، كل المسلم على المسلم حرام عرضه وماله ودمه، التقوى ههنا، بحسب امرىء من الشر أن يحقر أخاه المسلم) رواه الترمذي وقال حديث حسن (ورواه مسلم بلفظ آخر) واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ناپاكیی لەگەڵ ناكات و درۆی لەگەڵ ناكات و لەكاتی لێ قەوماواندا پشتی بەرنادات، هەموو شتێكی مسوڵمان لە مسوڵمان حەرامە، ئابڕوو حورمەتیوماڵیو خوێنی، پارێزكاری لێرەدایە -ئاماژەی بۆ دڵی موبارەكی

كردووە- ئینسـان ئەوەندە خراپـەی بەسە كـەبرای مسولمانی خۆی بەسووك بگرێ.

- (لایؤمن أحدكم حتی یحب لأخیه مایحب لنفسه) متفق علیه، واتـە: یـەكێك لـەئێوە بڕوا نـاهێنێ - مەبەست بڕوای كاملە- هەتا ئەوەی بۆ خۆی حەزی لێ دەكات بۆ براكەشی پـێ‌ی خـۆش نـەبێت (دیارە ئـەم فەرموودەیـە چـەمكی پێچەوانـە -مفهـوم المخالفه-كەشی هەر راستەو دەبـێ چی‌ی بۆ خـۆی پـێ ناخۆشە بـۆ برای مسولمانشی پـێ‌ی نـاخۆش بێت).

- (انصر أخاك ظالما أو مظلوما، فقال رجل: یارسول الله أنصره اذا كان مظلوما أرأیت إن كان ظالما كیف أنصره؟! قال: تحجزه -أو تمنعه- من الظلم فإن ذلك نصره) رواه البخاری، واتـە: یارمـەتی براكـەت بـدە زۆردار بێت یان زۆرلێكـراو پیاوێك گوتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر ستەم لێكراو بوو یارمـەتی‌ی دەدەم، بەڵام ئایا ئەگەر زۆردار بوو چـۆن یارمـەتی بدەم؟ فەرمووی: دەیگێڕیـەوە -یان پێشگیری لێ دەكەی- لە زولم، چونكە ئەوە یارمەتی دانیەتی.

- (حق المسلم علی المسلم ست: اذا لقیته فسلم علیه، واذا دعاك فأجبه، واذا استنصحك فانصح له، واذا

*عطس فحمد الله فشمته واذا مرض فعد واذا مات فاتبعه* ) رواه مسلم، ورواه البخاري بنحوه، واتە: هەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش -شت-ن، ئەگەر پێی گەیشتی سەلامی لێ بکە، وەئەگەر دەعوەتی کردی -یان بانگی کردی بۆ هەر کارێک کە شەرعی بێ- بەدەنگی‌یەوە بچۆ، وەئەگەر داوای ئامۆژگاری لێ کردی ئامۆژگاری بکە. وەئەگەر پژمیو سوپاسی خوای کرد پێی بڵێ (یرحمك الله) وەئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکە، وەئەگەر مرد دوای -جەنازەکەی- بکەوە، (دیارە مەبەست لەم شەشانە لێرەدا مافە سەرەکیو بەرچاوەکانن، ئەگەر نا مافەکانی برایەتی لە ئیسلامدا هەر لەمانەدا کورت هەڵنەهاتوون، بەبەڵگەی ئەوە کە لە فەرمایشتی تردا ئی دیکەش باسکراون، بۆ وینە لەفەرموودەیەکدا کە (متفق علیە)یە لە (براء بن عازب)ەوە دەفەرموێ: *(أمرنا رسول الله (ﷺ) بسبع..... وابرار المقسم)*.

- *(لاتباغضوا ولاتحاسدوا ولاتدابروا ولاتقاطعوا، وكونوا عباد الله اخوانا، ولايحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث* ) متفق علیە، واتە: یەکتر مەبوغزێنن، وەحەسوودی بەیەکتر مەبەن، وەپشت لەیەکتر

مەکەن و لەیەکتر دامەبڕێن، وەئەی بەندەکانی خوا پێکەوە برابن، وەحەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسولمانێک کە لەسێ ڕۆژان زیاتر واز لەبرای خۆی بێنێ -ونەیدوێنێ-.

دەتوانین لەکۆی ئەم حەوت فەرمودەیە کەمشتێکن لەخەروارێک ئەم خاڵانە دەربارەی هەق و مافی برایەتی ی نێوان مسولمانان لەسەر یەک بنووسین:-

١- دەبێ پشت و پەنای یەکتر بن و یەکتر بەهێز بکەن و دەستبار بۆ یەکتر بگرن.

٢- نابێ هیچ جۆرە زولم و ستەمێک لەیەکتر بکەن هەر لە گومانی بەد (*سوء الظن*)ەوە بگرە هەتا حەسوودیو زەم و غەیبەت و جاسووسیو جنێوو لێدان و ماڵ زەوت کردن یان دزین و کوشتن و خیانەتی ناموس.

٣- نابێ لەبەرامبەر دوژمندا لەیەکتر بێ دەنگ بن و یەکتر تەسلیمی دوژمن بکەن.

٤- دەبێ پێویستییەکانی یەکتر بەپێی بۆلوان جێ بەجێ بکەن.

٥- دەبێ بەپێی توانا خەم و خەفەتی یەکتر لابەرن و گرفت و کێشەی یەکتر حەل بکەن.


٦- دەبێ عەیب و عاری یەکتر داپۆشن مادام

فەوتانی هەقێكی شەخسی، یان بەرژەوەندییەكی گشتی گرنگتر لەو عەیب پۆشینەی تێدا نەبێ.

٧- نابێ هیچ جۆرە خیانەتێك بەیەكتر بكەن.

٨- نابێ درۆ لەگەڵ یەكتر بكەن.

٩- نابێ لەكاتی تەنگانەو لێقەوماندا پشتی یەكتر بەربدەن.

١٠- دەبێ هەموو شتێكی یەكتر لەسەر خۆیان بەحەرام بزانن -مەگەر شەرع حەڵاڵی كردبێ- بەتایبەت ئابڕوو نامووس و ماڵ و خوێن.

١١- دەبێ چی یان بۆ خۆیان پێ خۆشە بۆ یەكتریش پێیان خۆش بێ و، چی بۆ خۆیان حەزی لێ ناكەن بۆ یەكتریش هەروابن.

١٢- دەبێ نەهێڵن هیچ كامێكیان نەستەمی لێ بكرێ نەستەمیش بكات.

١٣- دەبێ رێزی یەكتر بگرن و یەكتر بەسووك نەگرن نەبەقسە نەبەكردەوە، بگرە بەدڵیش.

١٤- ئەگەر بەیەكتر گەیشتن سەلام لەیەكتر دەكەن وەلامی سلاوی یەكتریش دەدەنەوە-.

١٥- لەگەڵ یەكتردا قسە خۆش و روو گەشن (*والكلمة الطيبة صدقة*) متفق عليه، (*لاتحقرن من المعروف شيئا ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق*) رواه

مسلم.

١٦- هەرکاتێک بانگی یەکتری‌یان کرد بەدەنگ یەکترەوە دەچن -مەگەر بۆ کاری خراپ و بێ شەرعی-.

١٧- بەدەم دەعوەتی یەکترەوە دەچن -مەگەر بزانن حەرام و بێ شەرعی تێدایە-.

١٨- لەکاتی راوێژ بەیەکتر کردن و داوای ئامۆژگاری‌دا ئامۆژگاری یەکتر دەکەن و درێغی ناکەن.

١٩- حەز بەچاکەو خێری یەکتر دەکەن و ئیرەیی (حسد) بەیەکتر نابەن.

٢٠- پشتگیری یەکتر دەکەن و پشت لەیەکتر ناکەن.

٢١- هەمیشە لەگەڵ یەکتر دەبن و لەیەکتر دانابڕێن.

٢٢- ئەگەر لەیەکتریش تووڕەبن لە (٣) رۆژان زیاتر دەنگ لەیەکتر راناگرن.

٢٣- هەر کاتێک یەکێکیان پژمی‌و گوتی: سوپاس بۆ خوا (الحمد لله) پێ‌ی دەڵێن: خوا رەحمت پێ بکات (یرحمك الله).

٢٤- لەکاتی نەخۆش کەوتن دا لەیەکتر دەپرسن و

سەردانی یەکتر دەکەن و دوعاو قسەی خێر بۆ یەکتر دەکەن.

٢٥- ئەگەر یەکێکیان سوێندی خوارد بەپێی توانا هەوڵ دەدەن سوێندەکەی لێ نەخەن.

٢٦- یەکتری‌یان خۆش دەوێت و هیچ جۆرە بوغزو رق و کینەیەکیان لەگەڵ یەکتر نیە.

٢٧- هەر کاتێک شەهید بوو، یان وەفاتی کرد دوای تەرمەکەی دەکەوێو بەشداری ناشتنی دەکات.

هەڵبەتە دەگونجێ لەم خاڵانە زۆر زیاتر لەم فەرمایشتانەو غەیری ئەمانیش لەدەقەکانی قورئان و سووننەت هەڵهێنجین دەربارەی ئەرک و مافەکانی برایەتی لە ئیسلامدا، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە هەرچی لەو بارەوە هەیە بینوسین، بۆیە بەم ئەندازەیە واز دێنین لەم باسە..

## حەوتەم:

وەلەکۆتایی‌دا بەچاکی دەزانم بۆ قوڵترکردنەوەی ماندەری برایەتی‌و یەکڕیزی‌و تەبایی‌و بۆ ئەوەی هیچ کەس برایەتی‌و چاکە بە(دەستەوا)و لەبەرامبەر چاکەو برایەتی خەڵکی‌دا نەکات و دووچاری دەردی کوشندەی رەگەڵ رەگەڵ (امعة)یتی نەبێت و بەبێ هیچ جۆرە چاوەڕوانی‌یەک لەخەڵکی و سوپاس و

پـێزانین و پاداشـتیان چاكـەكاریو برایـەتی خـۆی ئەنجام بدات ﴿ولانرید منكم جزاء ولاشكورا﴾ الدهـر.. لەژێر سەرباسی (بەجێ هێنانی مافی برا لەبەر خوا) چەند راستی‌یەك بنووسم:

## بەجێ هێنانی مافی برا لەبەر خوا[٢]

شتێكی ئاشكرایە كەلە روانگەی ئیسلامەوە هـەموو چالاكیو جـم و جـۆڵ و كـردەوەو رەفتـاری ئینسـان بەخوا پـەرستی (عبـادة) لەقەڵـەم دەدرێـن و، خـوای بەرزو مەزن كەفەرمویەتی: ﴿وما خلقت الجن والانس الا لیعبدون﴾ الذاریات/٥٦، ناگونجێ مەبەسـت بـەس ئـەو شـتانە بن كـە لــە عورفــی زانایـانی شـەرعدا بەخواپەرستی (عبادە) ناسراون، وەك: نوێژو رۆژوو زەكـات و حــەج و زیكـرو دوعــاو... هتـد!، وە لەراستی‌دا زانایـانی ئیسلامیش بـەس بەمەبەسـتی روونكردنـەوەی لایەنـە جـۆراو جۆرەكـانی ئیسـلام و وەك مەسـەلەیەكی زانسـتی‌ی رووت زانیاری‌یـەكانی شـەرعیان بـۆ (عبـادات)و (معـاملات)و (جنایـات).. دابـەش كـردووە، ئەگـەر نـا وەك گوتمـان ئیسـلام

---

[٢] ئەم باسە لە كتێبی (چەند رێنوێنی‌یەك بۆ ئیسـلامی‌یەكانی كوردستان) وەرگیراوە بڕوانە لاپەڕە ([illegible])

هەموو جم و جۆڵ و چالاكی‌یە شەخسی‌و كۆمەڵی‌و ماددی‌و مەعنەوی‌یەكانی ئینسان بەخوا پەرستی لەقەڵەم دەدات وەبابای مسوڵمان لەهەر بوارو لایەنێكی ژیان و گوزەرانی‌دا سەرگەرمی كردو كۆش و چالاكی بێت واهەست ناكات كە لە جوغزی خواپەرستی چۆتە دەرێ‌و، مەیدانی پان‌و پۆڕی ژیانی لێ دەبێتە میحراب‌وپەرستگا (معبد)!

جا یەكێك لەو چالاكی‌و جمو جوڵە هەرە گرنگ‌و مەزنانەی ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە كە لەبواری برایەتی‌و هەڵس و كەوتی نێو كۆمەڵ و كۆمەڵگای ئیسلامی‌دا ئەنجامی دەدات، لێرەشدا بەرلەوەی بچینە نێو قووڵایی باسەكەوە بەپەسەندی دەزانم ئەم چەند دەقە بۆ دەرخستنی گرنگی بایەخ و گەورەیی برایەتی‌و یەكتر خۆشویستن بخەمە روو:

- (*ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان: أن يكون الله ورسوله أحب اليه ما سواهما، وان يحب المرء لايحبه الا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار*) متفق عليه، واتە: سێ خەسڵەت لەهەر كەسێكدا هەبن بەهۆی ئەوانەوە شیرنایەتی ئیمانی چێژتووە: كە خواو پێغەمبەرەكەی لەلا خۆشەویست تر بێ لەغەیری

وان، وەکەئینسانێکی خۆشویست بەس لەبەر خوا خۆشی بوێ، وەکەپێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە نێو کوفر دوای ئەوەی خوا قوتاری کردووە لێی، وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە.

- (*والذي نفسي بيده لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولاتؤمنوا حتى تحابوا، اولا ادلكم على شيء ان فعلتموه تحابتم؟! أفشوا السلام بينكم*) رواه مسلم، واتە/ سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتێ هەتا بڕوا نەهێن وەبڕوا ناهێنن هەتا یەکترتان خۆش نەوێ، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر کردتان یەکترتان خۆش بوێ؟ سەلام لەنێو خۆتان بڵاوبکەنەوە (دیارە سەلام کردن لێرەدا سەردان و چاکەو چۆنیو هەواڵپرسیو... هتدیش دەگرێتەوە).

- (*ان الله تعالى يقول يوم القيامة: أين المتحابون بجلالي؟ اليوم أظلهم في ظلي يوم لاظل الا ظلي*) رواه مسلم، واتە: خوای بەرز ڕۆژی دوایی دەفەرموێ: ئەوانەی لەبەر گەورەییو شکۆیی من یەکتریان خۆش دەویست لەکوێن؟ ئەمڕۆ لەژێر سایەی خۆمدا سێبەریان لێ دەکەم، ئەو ڕۆژە کەجگە لەسایەی من هیچ سایەی تر نین.

- (*قال الله تعالى: وجبت محبتي لمتحابين في*

*والمتجالسين في والمتزاورين في والمتباذلين في )* حديث صحيح رواه مالك بأسناد صحيح في الموطأ ، واتە: خوای بەرز فەرموویەتی: خۆشویستنی من پێویست بووە بۆ یەکتر خۆشویستان لە پێناومداو پێکەوە دانیشتووان لەبەر من و سەردانی یەکترکەران لەرێی منداو لەیەکتر بووردان لەبەر خاتری من.

ئێستا کە لەبەر تیشکی ئەم فەرمایشتانەدا تارادەیەک زانیمان گرنگیو پلەو پایەی برایەتیو یەکتر خۆشویستن لەئیسلام دا چۆنە! بابێینەوە سەر ئەسلی مەبەست:

مادام برایەتیو جێ بەجێ کردنی ئەرک و مافەکانی برایەتی لەگەڵ یەکتردا بەشێکی گرنگ و گەورەی خواپەرستی بێت، ئەگەر وەک هەر جۆرە خوا پەرستی‌یەکی تر دوو مەرجی (شەرعی بوون)و (بۆ خوا بوون) واتە *(الاتباع والاخلاص)*ی تێدا رەچاو کرابن، بەڵێ مادام وابێ دروست و رەوا نیە کە بەدەستەواو لەبەرانبەری شتدا بکرێ، چونکە ئەوکاتە دەبێتە جۆرێک لەبازرگانیو مامەڵە پێکەوە کردن وەزیاتر قالبێکی دنیاییو سیاسیو کۆمەلایەتی رووت بەخۆیەوە دەگرێو جیاوازی‌یەکی نابێ لەگەڵ هەڵس و کەوت و رەفتارو پەیوەندی

خەڵكی تری نائیسلامیو نامسوڵمان لەگەڵ یەكتر!

هەر بۆیەش خوای میهرەبان و زانا فەرمویەتی: ﴿يوفون بالنذر ويخافون يوما كان شره مستطيرا، ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا، أنما نطعمكم لوجه الله لانريد منكم جزاء ولاشكورا﴾ الانسان(٧-٩) هەروەها لەوەسفی یەكێك لەبەندە هەڵبژاردەو هەرە باشەكانیدا -كە لەسەر رای زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان (ابوبكر الصديق)ە خوا لێی رازی بێ[4]- فەرموویەتی: ﴿وسيجنبها الاتقى، الذي يؤتي ماله يتزكى، وما لاحد عنده من نعمة تجزى، الا ابتغاء وجه ربه الاعلى، ولسوف يرضى﴾ الليل/١٧-٢١.

هەڵبەتە شتێكی زۆر ڕوونە كە مسوڵمان لەبەرانبەر چاكەو پیاوەتی یەكتردا هەر چاكە بكەن وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿هل جزاء الاحسان الا الاحسان﴾ الرحمن/٦٠.. بەڵام مەبەستمان لە(بەجێ هێنانی مافی برا لەبەر خوا) ئەوەیە كە بابای

---

[4] وەك هەم (حاكم) لە (عامر) ئەویش لە (عبدالله بن الزبير) ئەویش لەبابی گێڕاویەتەوە، وەهەم (ابن ابت حاتم) لە (عروه) گێڕاویەتەوە، بڕوانە: (صفوة البيان لمعاني القرآن) ل٥٩٥.

چاكەكارو برای باش و دڵسۆز، لەبەرانبەر چاكەو برایەتی جێبەجێ كردنەكەیدا چاوەڕوانی لەبەرانبەرەكەی نەكات و كورد گوتەنی (چاكەو خێر بەدەستەوانیە! ) بەڵكو وەك گوتراوە (چاكەی بكەو بەئاویدا بدە! ) چونكە مادام مسولمان ئەوەی كە دەیكات وەك خواپەرستیو فەرمانبەری (*طاعة*) ئەنجامی دەدات، جێی خۆیەتی بۆ كرێ و پاداشتەكەی، جگە لە خوای دادگەرو سوپاسگوزار، چاوەڕوانی لەكەسی دیكە نەبێت، بۆ ئەوەی ئەگەر هاتوو بەرانبەرەكەی برایەكی چاك نەبوو و برایانە رەفتاری نەكرد، ئەو رەفتارە دزێوو سپڵەیانەنەبێتە هۆی ساردبوونەوەو خاوبوونەوەی لەچاكەكاریو وەفاداریو بەردەوام بوون لەسەر ئەو خواپەرستیو طاعەتە گەورەو گرنگە!

ئەبو هورەیرەش خوا لێی رازی بێ لەو بارەوە ئەم فەرموودە مەزنەمان بۆ دەگێڕێتەوە: ( *..ان رجلا قال: یارسول الله ان لي قرابة اصلهم ویقطعوني، وأحسن الیهم ویسیئون الي، وأحلم عنهم ویجهلون علي! فقال: لان كنت كما قلت فكأنما تسفهم المل، ولا یزال معك من الله تعالی ظهیر علیهم مادمت علی ذلك* ) رواه مسلم، واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من

هەندێک خزمم هەن، سەردانیان دەکەم و ئەوان دەمپچڕێنن، وەچاکەیان لەگەڵ دەکەم و ئەوان خراپەم لەگەڵ دەکەن، وە لەگەڵیان هێدیو مەندم و ئەوان نەفامیم لەگەڵ دەکەن! فەرموی: ئەگەر تۆ وابی کە گوتت ئەوە وەک ئەوە وایە لمی گەرمیان پێ بخورێنی، وەهەتا تۆ لەسەر ئەوە بەردەوام بی هەمیشە لەخوای بەرزەوە پشتیوانت هەیە لەبەرانبەریاندا.

بەڵێ. بەدەردی یەکێک لەزاناو پێشەوایانمان دەرهەق بەکەسێک کە لە بەرانبەری چاکە کاریو برایەتی دلسۆزیویدا خراپەکاریی دەکرد فەرمویەتی: (*لئن هو عصى الله فينا فإنا لنطيع الله فيه!!*) باهەر کەسێک لەهەڵس و کەوت و رەفتاری لەگەڵماندا سەرپێچی خوای کردو خۆی دووچاری تاوان و لاوازی کرد، ئێمە بەپێی فەرمانی: ﴿*وأحسنوا ان الله يحب المحسنين*﴾ *البقرة/١٩٥*.. هەر چاکە بکەین و فەرمانبەریو بەندایەتی خوا بکەین لەهەڵس و کەوتمان لەگەڵیدا.

ئینجا لەراستیدا ئەگەر بێت و ئاوا نەکەین - کەگوتمان-. ئەوە کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامیمان دەبنە گۆرەپانی پێش بڕکە (*مسابقة*)ی خراپەو

خراپەکاری، لەباتی ئەوەی مەیدانی پێش برکەی خواپەرستیو چاکە کاری بێت، وەبێگومان ئەگەر وانەکەین ئەوا مانای وایە هەموو ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت کە فەرمان دەکەن بەچاکە کاریو خێرخوازیو دلسۆزیو سوود گەیاندن بەمسولمانان و وەلامی خراپەدانەوە بەچاکەو بگرە چاکتریش ﴿ادفع بالتي هي احسن السيئة..﴾ المؤمنون/٩٦، هەمووی فەرامۆش کران و لەکارخران، چونکە بەراستی هەروەک پێشینان گوتویانە (پیاوەتی گۆشتی بەلەکە دەبێ بیپچڕێ!) وەکۆمەلگاش حەتمەن لەخەلکی نەخۆش و بێ وەفا هەر خالی نابێت و ئینسان ئەگەر بێت و هەرچی چاکەی لەگەل نەکات و وەلامی چاکەکەی بەچاکە نەداتەوە، چاکەی لەگەل نەکات سەرنجام وەک (درۆزناو) تووشی ئیشک بوون و چڕەبڕبوون دەبێو بڕۆ بەخێرهاتی!!

کۆتایی ئەم خالەش بەم سەرگوزەشتە پڕ پەندو عیبرەتە دێنم:

دەگێڕنەوە کابرایەکی زۆر خێرخواو نان بدەو سەخی دەبێ، ڕۆژێکیان یەکێک دەچێتە لایو داوای یارمەتیو کۆمەکی لێ دەکات، ئەویش زۆر خزمەتی دەکات و ئەوەندەی پێشی دەکرێ

یارمەتیی دەدات، بۆ رەوانە کردنەوەیشی بۆ خۆی ماوەیەكی باش لەگەڵی دەچێو وڵاخێكی نقد رەسەنیشی پێ دەبێت! بابای خێرپێ كراو پێی دەڵێ لەبەر ئەوەی كاتی خۆی (سوار) بووم و ئێستاش ئەسپم نەماوە، ئەگەر زەحمەت نەبێ ئەسپەكەتم بدەیە تۆزێك رمبازێنی پێ بكەم! ئەویش ئەسپەكەی وێ دەدات و چەند جارێك ئەسپەكە تاو دەدات و دەیهێنێو دەیبات، هەتا دواجار لەكابرای خێرخواز نزیك دەكەوێتەوەو پێی دەڵێ: من خوا حافیزو تۆش بگەڕێوەو ئەم ئەسپە بۆ من باشەو ئاوزینگێكی لێ دەدات و تێی دەتەقێنێو دەڕوات، ماوەیەك دوور دەكەوێتەوەو كابرای خاوەنی ئەسپ دەڵێ: تۆزێك بوەستە یەك دوو قسەت لەگەڵ دەكەم و بڕۆ خوات لەگەڵ! ئەویش تۆزێك پێ دەگرێتەوەو دەڵێ: فەرموو چیت هەیە بیڵێ! دەڵێ: ئەسپەكە بەرەو بڕۆ بەگەردن ئازایی پێتی دەبەخشم و لێی ناپێچمەوە، بەڵام یەك تكام هەیە، ئەویش ئەوەیە كە لەلای هیچ كەس مەڵێ ئەو ئەسپەم ئاوا دەست كەوتووەو فڕاندوە! دەڵێ بۆچی؟ دەڵێ: تاكو چاكەو خێركردن لەدڵی خەڵكیدا نەمرێ (*حتى لايموت المعروف في قلوب الناس*)و خەڵك لەچاكە كردن بەشیمان نەبنەوە!

# دواقسەم

**خوشك و برا خۆشەویست و شیرین و سەنگینەکانم!**

وەرن بابەم جۆرەی کەباس کرا پێکەوە برایەتیو دۆستایەتی بکەین، تاکو دینداریو مسولمانەتییەکەمان تەواو بێ لەکەبێت و، لەبەرەکەت و بەرهەمی ئەو جۆرە برایەتیو دۆستایەتییە ئیمانییەش بەسەر هەموو کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێگاماندا زاڵ بێت و تەختیان بکەین وەبەپشتیوانی خوای میهرەبان و دەرووکەرەوە درێژە بەخەبات و کاری ئیسلامییانەمان بدەین هەتا سەرەنجام دەگەینە هەوارگاو مەنزڵی حوکم و کیان و دەستەڵاتی ئیسلامی لەوڵات و دەوروبەرماندا، ئینجا بێ گومان مادەم بەو عەزم و ئیرادەیەو بەونیازو مەبەستە کەوتبینە ڕێ، لەگەشت و سەفەری ئەم ژیانەماندا بەو هەوارگاو مەنزڵە کە وا فەرمانی پێ کردووین پێی بگەین، بگەین یان نا، مادام کەمتەرخەمیو دەغەڵیو پۆخەڵی نەکەین گەیشتنمان بەهەوارگەی حەقیقیو ژیانی نەبڕاوەی نێو بەهەشتی ڕازاوە هەر مسۆگەرەو دیارە هەر ئەمەش لوتکەی هەرە بەرزی ئاوات و هیوایەکانی ژیانی ئینسانی مسولمانە لەسەر زەوی.

*﴿تلك الدار الآخرة نجعلها للذين لايريدون علوا في الارض ولا فسادا والعاقبة للمتقين﴾ القصص*

١٢/رمضان/١٤١٨



١٩٩٨/١/١١

هەولێر